# پێشەکی

زەنجیرە باسێک لە سەر ئیسلام و داهێنانی تەکنەلۆجیاو سەردەمی زێرینی ئیسلام و دواکەوتن و هۆکارەکان و گەیشتنی موسڵمانان بەم ڕۆژە.....

ئەگەر ئێمەی موسڵمان هۆی دواکەوتن و دانەهێنانی تەکنەلۆجیا پابەند بوونمان بە ئیسلام و موسڵمان بوونمانەوە بێت ، ئەی ئێوەی عەلمانی بۆ لە ئێمە دواکەوتوترن بە درێژایی مێژوو نەتوانتوانیوە درزیەکی درومان و عەلاگەیەکی زبڵ دروست بکەن؟!!!

ئەی خۆ ئێوەو حیزبەکەتان پابەند نین بە ئیسلام و قورئانەوەو موسڵمان نین ، ئەی بۆچی تاکو ئێستا <هێشەماڵەیەک ، دۆژەنکەیەک ، دەسەڵخوردێک ، هێش و چەڵەم و گورێس و چەقۆو داس و تەورو مێخوسکەیەکتان> دروست نەکردووە ، ئەوە زیاتر لە حەفتا ساڵە بۆچی داهێنانێکتان نەکردووە؟!!!

بەردەوامیش بێ ئیش بوون و تەنیا خواردن و خەوتنتان بووە ، ئەی بۆ بیرێکی جوان و داهێنانێکتان پێشکەش نەکردووە؟

چەواشە کردنی تەکنەلۆژیاو شارستانییەت.

# ئایا تەکنۆلۆژیا موڵکی ئەو شارستانییەتەیە کە لە سەر عەلمانییەت بونیادنراوە؟
## دروستکردنی گومانێکی تر...
## بەشی یەکەم

وەک لای هەموان ڕوونە ، ڕۆژئاواو ڕۆژئاوایەکان تێکڕا تامەزرۆی ژیانێکی ئاسوودەو سەرکەوتوو تازەو کەم وێنەن ، بۆ ئەوەی خۆیان بناسن و خۆیان وا پیشان بدەن کە خۆیان پاڵەوانی تەکنەلۆژیان....

ئەوان لە بنەمادا ئامانجیان ئەوەیە هەموو چەواشەکارییەك بکەن بۆ ئەوەی سەرنجی گەلان بە تایبەت گەلانی ژێردەستەو ستەم لێکراو بۆ لای خۆیان ڕابکێشن ، کە عەلمانییەت سەرچاوەی بەختەوەری و کامەرانی و خۆشبەختییە ، ئەمەش بە چەواشەکاری غەزوی فیکری دادەنرێت لەو وڵاتانەدا ، ئەوان دەیانەوێت بەم سەرلێشێواوییە بنەمایەکی باتڵ بونیاد بنێن ، ئەوەش ئەوەیە:

سەرنجی سەرجەم زانا و سیاسی و نووسەر و ڕۆشنبیران بۆ لای خۆیان ڕاکێشن و پێیان بڵێن:

ئەو تەکنۆلۆژیایەی کە بووەتە نیعمەت و ژیانی ئاسان کردووە ، نیعمەت و هاوردەی ڕۆژئاوایەکانەو ئەوانیش بنچینەو بونیادیان لە سەر عەلمانییەت دانراوەو دامەزراوە ، واتە بە کوردی سەرقڵاو زەهاوی دەڵێن : ئەگەر دەتانەوێت پێش بکەون و ببن بە خاوەنی تەکنۆلۆژیای نوێ وەرن هەمووتان ببن بە عەلمانی یان ڕێچکەی عەلمانی هەلبژێرن ، لە بەر ئەوە ئەم شارستانییەتە ڕۆژئاواییە لە سەر عەلمانییەت دامەزراوەو فەزڵەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوان!......

ئەوان هەندێك جار نایشارنەوەو بە ڕاشکاوی دەڵێن : ئەگەر ژیانێکی گەش ببن و خۆشگوزەران و کۆمەڵگەیەکی بەختەوەرتان دەوێت وەرن ببن بە عەلمانی و ئەوەش ڕێگەو ڕێبازی عەلمانی لە خزمەتایە بۆ خزمەتکردنتان ، ئەمەش فرت و فێڵێکی ترەو دروستکردنی گومان و تەم و مژاوی کردنی ئیسلام و قورئانە کە لە ڕێگەی تەکنەلۆژیاوە دەیانەوێت بێ بەهای بکەن و دڵی شوێنکەوتووانی ساردو سڕ بکەن ، ئەمەش هەوڵێکە لەو هەوڵە شکستخواردوانەی کە بەردەوام داویانەو دەیدەن!...

ئەوان شەرم ناکەن و دەڵێن : ئەوە عەلمانییەتە ، بیکەن بە ڕێبازو بەرە بەرە چیتان پێ دەڵێن جێ بە جێی بکەن و هەموو فەرمانێك لە ئێمە وەر بگرن و چی ڕێنماییەکمان پێ دان تەنفیزی بکەن ، ئەو کات ئێوەش دێنە ئاستی ئێمەو دەبنە خاوەنی تەکنۆلۆژیای سەردەم و دەبن بە گەلێکی خاوەن شارستانیەت و تەکنۆلۆژیاو پێشکەوتن لە سەرجەم بوارەکان بە دەست دێنن و هیچتان لە ئێمە کەمتر نابێت.

بە کورتی ئەوان دەڵێن:

**تەکنۆلۆژیا موڵکی ئەو شارستانییەتەیە کە لە سەر عەلمانییەت بونیاد نراوە.....**

**ئەم گومانە زیاتر لە ڕێگای کڵێساو قشەکانەوە بەڵاو دەکرێتەوەو مولحیدو عەلمانی و بێ دینەکانی کوردیش بە پەلەو بە سەقەتی کۆپی پەیستی دەکەن و بەڵاوی دەکەنەوەو فو دەکەن بە دەهۆڵە دڕاوو بۆڕنەکەیاندا ، ئەمەش ڕاست نییە و درۆیەکی شاخدارەو تەکنۆلۆژیا موڵکی ئەو شارستانییەتە نییە کە ئەوان باسی دەکەن ، ئەمە تەنیا فرت و فێڵ و فریودانەو هیچی تر......**

**ئەگەر بە وردی تەماشای تەکنۆلۆژیاو شارستانییەت بکەین ئەوە درۆو فێڵەکانی ئەوانمان بۆ دەر دەکەوێت ، لە بەر ئەوە پێشکەوتنی تەکنەلۆژیا شتێکەو شارستانییەتیش شتێکی ترە.**

**شارستانێتی بریتیە لە دیدو تێڕوانین و پێناسەی شتەکان و شێوازی ڕەفتاری دروست لەگەڵیاندا،ئەمەش ناکرێت ببێتە هۆی خۆنواندن و خۆدەرخستن و خۆبادان و فڕو فیشاڵی ڕۆژئاوا کە بانگەشەی ئەوە بکەن گوایە ئەوان خاوەنی ئەو تەکنەلۆژیانەن!....**

**ئەگەر چاوێك بخشێنین بە داهێنانەکانی ڕۆژئاوادا ئەوە بۆمان دەر دەکەوێت هیچ داهێنانێکیان نەبووە لە بورای سەربازی و ئیستیخبراتی و موخابەراتیدا ، کەواتە لە بواری سەربازیی و موخابەراتیدا رۆژئاوا هیچ شتێکی دانەهێناوە کە یەکێتی سۆڤیەتی کۆن و روسیای ئێستا داینەهێنابێت !**

**ئەمەش نەك تەنیا لە بورای کەل و پەل و کەرەستە سەربازیەکاندا تەنانەت لە چەندین لایەنی تری پیشکەوتووی وەکو پزشکی وگەیاندن ، باشە خۆ ئەم وڵاتە شارستانێتی خۆی لە بنچینەی سەرمایەداری دانەمەزراندووە.**

**ئەم تەسەورو تێڕوانینە هەڵەیەو چەواشەکردنی وڵاتانی ژێردەستە بە زەقی دیارەو ئەو بانگەشەیەش بە درۆو دەخاتە کە ئەو پێشکەوتنە تەکنۆلۆژیایە موڵکی ڕۆژئاوا نییە و فەزڵەکەی بۆ ئەوان ناگەڕێتەوە.**

**ئەمەش ڕوون و ئاشکرایە ئەگەر بە وردی چاوێك بخشێنین بەو پێشکەوتنەدا زۆر وەسیلەو ئامێرو ئامرازو کەرەستەو دەستگای پزشکی و سەدان جۆر دەرمان و عیلاج و چارەسەر هەیە کە لە وڵاتانی یابان و مالیزیاو بەرازیل و ئێران و مەککەی پیرۆز و چەندین وڵاتی تری ئیسلامی دروست دەکرێت ، یان دەدۆزرێتەوەو دادەهێنرێت ، بۆ نموونە پۆستی (هۆت مایل) موسوڵمانێکی هیندستانی دروستی کرد کە لە ڕوی خێرایی و نهێنییەوە لە (یاهو) گرنگترو باشترە.**

**ئەگەر باسی پێشکەوتنی پزیشکی هەر کۆنەوە تاکو ئیستا بکەین ئەوە بە ڕاستی فەزڵی ئەو سەرکەوتنەش دەگەڕێتەوە بۆ موسوڵمانان ، ڕۆژئاوایەکان و زانا بە ئینسافەکانیان خۆیان ئیقرار بەوە دەکەن کە ئەوان قەرزای موسوڵمانانن هەر بۆیە نەك هەر لە بورای پزشکییەوە لە هەموو بوارێکەوە موسوڵمانان پێشرەویان بووە ، ئێمە باسی پێشکەوتنە نوێکانی موسوڵمانانی لێرەدا ناکەین پیمان باشە باسی هەندێك**

نموونە بکەین کە کاتێك ڕۆژئاوا ناوی نەبووەو ناوی پێشکەوتنیان نەبیستووە موسوڵمانان چۆن داهێنان و دۆزینەوەیان هەبوو ، ئەمەش تەنیا مەشتێکە لە دەشتێک ، دواتر بە جوانی باسی دەکەین:

## ابن هیثم

ئایا دەزانن ( ابن الهیثم ) زانای ( ریاضیات و فلك و فیزیا ) بووە ؟

ئایا دەزانن ناوبراو داهێنەری ( کامیرا ) بووە کە بە کۆڵەکەی ژیانی ئیعلامی نوێ دادەنرێت؟

ابن هیثم لە زانستی گەردونناسی – علم الفلك نزیکەی 20 کتێبی دەستنووسی هەیە لەو کتێبانەدا زیرەکی و لێهاتووی بیرکاری ابن هیثم دەردەکەوێت کە لە زۆر لایەنی فەلەکییەوە موناقەشەی کردووە ،

کتێبەکانی ابن هیثم:

ئەوەی زانراو بێت تاکو ئێستا ابن هیثم نزیکەی 200 کتێبی هەیە بێجگە لە زۆر نامەی تری جیاواز، لە:

(الهندسة والطبيعيات، والفلك، والحساب والجبر والطب والمنطق والأخلاق) دا.

25 لەو کتێبانە پەیوەندیان هەیە بە (الرياضيات والعلوم التعليمية) ،

43 لەو کتێبانە پەیوەندی بە (الفلسفة والفيزياء) ە هەیە.

ئەوەش پەیوەندی بە پزشکی (الطب) ەوە هەیە گەیشتووە بە 30 بەش.

ئەو 30 بەشەش کتێبێکە لە :الصناعات الطبية نظمه من جمل وجوامع مارآه مناسباً من كتب غالينوس) کە دەکاتە 30 کتێب و بەم شێوەیە:

1. لە (البرهان)
2. لە (فرق الطب)
3. لە (الصناعة الصغيرة)
4. لە (التشريح)
5. لە (القوى الطبيعية)
6. لە (منافع الأعضاء)
7. لە (آراء أبقراط وأفلاطون)

8. له ( المني)
9. له ( الصوت)
10. له (العلل والأعراض)
11. له(أصناف الحميات)
12. له(البحران)
13. له(النبض الكبير)
14. له (الأسطقسات على رأي أبقراط)
15. له (المزاج)
16. له (قوى الأدوية المفردة).
17. له (قوى الأدوية المركبة)
18. له (موضوعات الأعضاء الآلمة)
19. له (حيلة البرء)
20. له (حفظ الصحة)
21. له (جودة الكيموس ورداءته)
22. له (أمراض العين)
23. له ( أن قوى النفس تابعة لمزاج البدن)
24. (سوء المزاج المختلف)
25. له (أيام البحران)
26. له (الكثرة)
27. له ( استعمال الفصد لشفاء الأمراض)
28. له ( الذبول)
29. (أفضل هيئات البدن)
30. له (جمع حنين ابن إسحاق من كلام غالينوس وكلام أبقراط في الأغذية).

# ابن سينا

**پزشك و فەیلەسوف و زانای بە ناو بانگ و دیار**

**ناوی تەواوی:**

**أبو علي الحسين بن عبد الله بن الحسين بن علي بن سينا الملقب بالشيخ الرئيس،**

**ژیان و ژیاننامەی ابن سينا زۆر دورو درێژەو زۆر شتی سەرسوڕهێنەر لە ژیانیدا ڕوویداوە کە ناتوانین هەمووی لێرەدا بنووسین ، ابن سينا هەر لە منداڵیەوە قورئان خوێن بووەو هەرکات لە بیرکردنەوەو داهێنان و دۆزینەوەدا سەرگەردان بوبایەو وڵامی ڕاستی و دڵنیایی دەست نەکەوتایە ئەوە پەنای دەبردە بەر دەرگای خوای مەزن و دەڕۆیشت بۆ مزگەوت و نوێژکردن و پاڕانەوە تاکو بیرێکی جوان دەهات بە مێشکیداو چارەسەری دەدۆزییەوە.**

**ابن سينا زانستی بەرزو بەرچاوی بووە لە زانستی پزشکی و دەرونی (علم الطب وعلم النفس) زۆر نووسینی بە ناو بانگی هەیە لە: (الطبيعيات والهندسة والرياضيات والكيمياء) دا و بێجگە لەمانەش زۆر کتێبی بووە کە تایبەت بووە لەو بوارانەدا وەکو :**

**کتێبی : (المختصر الأوسط في المنطق)**

**کتێبی : ( المبدأ والمعاد)**

**کتێبی : (الأرصاد الفلكية)**

**کتێبی : (القانون)**

**کتێبی : (الحيوان والنبات)**

**کتێبی : (الهداية) کاتێك لە قڵای (نردوان) لە زیندان بو ، بۆماوەی چوار مانگ ئەم کتێبەی نووسی ، زۆر نووسین و کتێبی تری هەیە کە ئێستا ئێمە ناتوانین هەمووی لێرەدا بنووسین.**

**ڕۆژئاوایەکان چۆن تەماشای ابن سينايان دەکرد:**

**ابن سينا ڕێزو پلەو پایەیەکی تایبەتی هەبوو لای زانا و لێکۆڵەران بە درێژایی سەد و سەردەمەکان،**

(جورج ساتون) دەڵێت: ابن سینا کەسێکی خاوەن فیکری مەزنبوو واتە دیاردەیەکی فیکری گەورە بو کەسمان نییە بەراوردی بکەین لە گەڵ زیرەکی و لێهاتوویی و نەشاتی بەرهەم هێنانی ئەودا ، فیکری ابن سینا لە بارەی فەلسەفەوە لە سەدەکانی ناوەڕاستدا بە نموونەی هەرە بەرزو باڵا دەبینراو پێناسە دەکرا.

(دي بور) دەڵێت : کاریگەری ابن سینا لە فەلسەفەی مەسیحیەتدا لە سەدەکانی ناوەڕاستدا زۆر گەورە بەرزو باڵاو بە نرخ بوو ، ابن سینا لە پلەو پایەدا وەکو (أرسطو) بو.

(أوبرفيل) دەڵێت : ابن سینا لە سەدەکانی ناوەڕاستدا زۆر بە ناو بانگ بو ناوو ناوبانگی کەوتە سەر هەموو زمانێك ، نرخی ئەو پیاوە زۆر بەرزو بە نرخ بوو موفەکیرێکی بەرزو باڵا بوو سەدەو سەردەمەکەی ڕازاندبووەوە ، ابن سینا لە ڕیزی مرۆڤە گەورەو مەزنەکانە.

(هولمیارد) بەم شێوەیە پێناسەی ابن سینا دەکات : زاناکانی ئەوروپا پێناسەی (أبا علی) بە (أرسطو طالیس العرب) دەکەن ، هیچ گومانی تێدا نییە کە ئەو زانایەکی بەرزو بێ وێنە بووە لە زانستی پزشکی و زانستی تەبەقاتی زەوی ، ابن سینا کاتێك هەر بیرکردنەوەو دۆزینەوەیەك لای گران بوبایەو بێتاقەتی بکردایە ئەوە دەڕۆیشت بۆ مزگەوت و نوێژی دەکردو دەپاڕایەوەو دواتر گرفتەکەی بۆ چارەسەر دەبوو.

زۆر پێناسەو ڕێزگرتن و بەرز ڕاگرتن لە لایەن زانا بەرزەکانی جیهانەوە لەو بارەیەوە هەیە ، هەر بۆیە ناتوانین هەمووی بێنیننەوەو لێرەدا بینووسین ، تەنیا ئەوە بەسە بۆ ئەو پیاوە موسوڵمانە قورئان خوێنە کە ئێستاش وێنەکەی لە سەر گەورەترین قاعەی کۆلێژی پزشکی لە زانکۆی پاریس هەڵواسراوەو دەبینرێت.

کتێب ونووسراوەکانی ابن سینا لە فەلسەفەدا:

•الإشارات والتنبیهات.

•الشفاء.

•النجاة

کتێبەکانی لە الریاضیات:

•رسالة الزاویة

•مختصر إقلیدس

•مختصر الارتماطیقي

•مختصر علم الهیئة

**•مختصر المجسطي**

**كتێبەكانى لە الطبيعيات وتوابعها:**

**•رسالة في إبطال أحكام النجوم**

**•رسالة في الأجرام العلوية وأسباب البرق والرعد**

**•رسالة في الفضاء**

**•رسالة في النبات والحيوان**

**كتێبەكانى لە الطب:**

**•كتاب القانون. ئەم كتێبە تەرجومە كراوە بۆ چەند زمانێك و چەندين جار لە چاپ دراوەو لە زانكۆكانى ئەوروپا تاكو كۆتايى سەدەى هەڤدەيەم دەخوێنراو ئێستاش سوودى لێ وەر دەگيرێت بە شێوەيەكى سەردەميانە.**

**•كتاب الأدوية القلبية**

**•كتاب دفع المضار الكلية عن الأبدان الإنسانية**

**•كتاب القولنج**

**•رسالة في سياسة البدن وفضائل الشراب**

**•رسالة في تشريح الأعضاء**

**•رسالة في الفصد**

**•رسالة في الأغذية والأدوية**

## جابر بن حيان

**جابرى كوڕى حەيان يەكەم كەس بو لە سەدەى هەشتەمدا داهێنانى ئەو عەمەلياتە كيميائيانەى خوارەوەى كرد:**

***التقطير الخالص .**

***الترشيح .**

***التبلور ، التَمَيّع Liquefaction ، التكرير ، الأكسدةوالتبخير .**

## ئەبوبەکری ڕازی

**لە سەدەی نۆیەمدا ئەم عەمەلیاتە کیمیائیانەی داهێنا:**

***التقطير الجاف .**

***التكليس .Calcination**

***التحليل،التصعيد ، التلغيم Amalgamation ، التشميع، بالإضافة إلى طريقة لتحويل المادة الكميائية إلى عجينة سميكة أو مادة صلبة قابلة للإنصهار .**

**ئایا دەزانن پیاوی فەلەکی و شاعیرو ئەندازیار**

## ( عباس کوڕی فرناس)

**یەکەم کەس بو کە ئالەتی بەرزبوونەو فڕینی دروستکرد پێش لەوانەیتر بە هەزار ساڵ ، بەڵێ بە هەزار ساڵ!....**

**ئایا دەزانن ناوبراو بەو ئالەتە لە سەر میئیزەنەی شاری قورطوبیە بۆ یەکەم جار فڕی؟**

**ئایا دەزانن داهێنانەکەی عباسی کوری فرناس یەکەم جار بو لە مێژوی مرۆڤایەتیداو دواتر ئالەتی نوێترو جوانتری دروستکردو لە سەر بەرزایی چیاکان فڕی؟**

**ئایا دەزانن دواتر باڵ و کلکی تەیارەی دروستکردو بە تەواوی نەجاحەتی هێنا؟**

**بەڕێزان ئەوە دلۆپیك بو لە دەریایی پێشکەوتن و داهێنان و دۆزینەوەی موسوڵمانانی پێشوو ئەو کاتەی مرۆڤ لە ئاستێکی نزمدا بوو، ئەگەر بێت و باسی پیشکەوتنەکانی موسوڵمانان و دۆزینەوەو داهێنانەکانیان لە سەرجەم بوارەکاندا لێرەدا بنووسین ئەوە هەزاران لاپەڕەی دەوێت ، ئەوەش تەنیا وەک مشتێک لە خەرمانێک هێنامانەوە ، بۆ ئەوەی ڕۆژئاوایەکان لە خۆیان بایی نەبەن و ئەو تەکنۆلۆژیایە نەکەن بە ئالەت و ئامرازی پێشکەوتن و شارستانییەت و پاشان عەلمانییەتی لە سەر بینا بکەن و دواتر وا پیشانی بدەن کە ئەمە خێرو بیری عەلمانییەتەو دواتر لەم ڕێگەیەوە بە وڵاتانی ژێردەستە لە ڕێگەی نۆکەرو چڵکاوخۆرەکانیانەوە بڵێن : وەرن بین بە عەلمانی و عەلمانییەت بکەن بە سیستەم تاکو پێش بکەون!......**

ئەگەر بە وردبینییەکی زانستی و مەنتیقی لە ئەو پێشکەوتن و پیشەسازی و تەکنۆلۆژیای ڕۆژئاوا ورد بینەوە کە خۆیانی پێ با دەدەن و فڕو فیشاڵی پیوە دەکەن ، هەر هەموو لایەنەکانی پێشکەوتنیان نەبووەتە بەربەست و ڕێگر لە ڕێگای ئەو چارەڕەشی و بەدبەختی و خەمۆکی و دڵکپی و کوێرەوەری و سەرجەم نەخۆشیە دەروونیانە کە بەرۆکی کومەڵگای ڕۆژئاوایان گرتووەو پێیەوە دەناڵێن و ڕۆژانە خۆیان دەکوژن......

ئەمەش زۆر شتی جیاوازو جۆراو جۆر لە خۆ دەگرێت کە بە داخەوە لێرەدا ناتوانین بە تەواوی هەمووی بنووسین ، کە ئەگەر پیشکەوتنەکانیش بۆ ئەوان بگەڕێنینەوە ، نەبووە بە هۆی دڵگەشی و خۆشی و ئاسوودەیی دەروونی ، تەنانەت ئەو نەگبەتی و بەدەبینی و ڕەشبینی و بێزارییە لەو وڵاتانەدا هەیە زۆر دەگمەنن و لە وڵاتانی ژێر دەستەو دواکەوتودا بوونی نییە ، ئەگەر هەبیت بە ڕێژەیەکی زۆر کەمەو ڕێژەکەش دەگەڕێتەوە بۆ عەلمانیە کەلە ڕەق و مێشک ڕەشەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەراست کە بکوژو ببڕ خۆیان و خۆیان لە سەر کورسی دەسەڵاتن.......

ئەوەی ئەوان لە مەدەنییەت و زانست تێگەیشتوون هەڵەیە ، هەر بۆیە شیرازەی ژیانیان شێواوەو ئیحساس بە ئاسوودەیی ناکەن ، مەدەنییەت و زانست هۆکارو شێوازن ، تەنیا مرۆڤەکان بۆ خۆشگوزەرانی و ئاسانکاری ژیان سوودیان لێ وەردەگرێت و بە کاریان دەهێنێت ، بۆ زیاتر ناسین و ناساندنی ڕاستی شتەکان بەکاریان دەبات ...

مەدەنییەت و زانست بۆ زۆر شت بە کار دەبرێت ، بۆ چۆنیەتی ژیانێك کە لە گەڵ دیدو تێروانینیی خوێدا بگونجێت ، واتە ئەگەر پێناسەی چۆنیەتیی ژیان لای ئەو لە دیدو تێروانین و پێناسەیەکی خوارو خێچ و هەڵەوە هاتبێت، ئەو هۆکاری مەدەنی و زانست و تەکنۆلۆژیانەش بۆ ئەو چۆنیەتیە خراپە بەکار دەهێنێت، ئەمەش سیستم و ئاڕاستەی خراپی لێ دەکەوێتەوە.. ئەوە کۆمەڵگەی ئەم کەسە دیدو تێروانین لێڵە بەو تەکنۆلۆژیایەوە ئیدارەو ئاڕاستەی دەکات، کە بیجگە لە ناخۆشی و ناڕەحەتی و پشێوی هیچی تری لێ چاوەڕوان ناکرێت.

کەواتە (غارودی) پێناسەیەکی زۆر جوانی لەم بارەیەوە هەیەو شایانی ئەوەیە باس بکرێت:

فەیلەسووفی فەرەنسایی غاروودی کە لە سەرەتای هەشتاکانی سەدەی رابوردوودا موسوڵمان بوو دەڵێ: (ئێمە ئێستا لە بۆگەنبوونی مێژوودا دەژین، هەر وەکو ئەو کاتەی کە بۆگەنی مێژوو لە ئیمپراتۆریەتی ڕۆما دەهات، ڕۆژئاوای ئێستا وەکو ئیمپراتۆریەتی ڕۆما هەیبەت و هەیلەمانی سەربازیی زۆرە، بەڵام پرۆژەی دیدو تێروانینێکی مرۆڤایەتییانەی نیەو پیشکەشی بکات، تا واتای ژیان و پێناسەی ڕاست و دروستی مێژوو بخاتە بەر دەست) ! (گۆڤاری الوعی ژمارە 62 ل 10).

فەیلەسووفی ئینگلیزی (جوود) دەڵێت: (زانستیە سروشتیەکان هێزێکیان خستۆتە بەر دەستمان کە شایانی خواکانە، بەڵام ئێمە وەکو منداڵ گەمەی پێ دەکەین و وەکو دڕندە بەکاری دەهێنین)! (قصة الحضارة ب12/1).

شارستانێتی ڕۆژئاوا تەکنۆلۆژیای بۆ دروست کردنی بۆمبی ئەتۆمی بەکارهێنا، کە مەلایین مرۆڤی پێ ریشەکێش کرد، دەیان شەڕو سەدان فیتنەی ناوخۆو دەرەکی بۆ کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی نایەوە، بۆ ئەوە بەرهەمە جەنگیەکانی بفرۆشێت و بازاڕی خۆی پێ گەرم و ساز بکات! تەکنۆلۆژیا بە دەست ئەوانەوە بوو بووبە مایەی پیسکردن و تێکدانی ژینگەو سازکردنی کەشێکی پیس و ڤایرۆساوی و دەرکەوتنی دەیان نەخۆشی نوێ !!

ئەو پێشکەوتنە پزیشکیە چی پێ دەکرێت کە لە بەر ئەو شاڵاوە تەکنۆلۆژیایەدا وەستاوە کە نەخۆشی بەڵاو دەکاتەوە؟ !

ئەو پزیشکیە چی چارەسەر دەکات؟ !

لە کۆمەڵگەیەکدا کە هەمووی مومارەسەی ڕەوشتی ئیباحی و ڕەفتاری نامۆیی دەکات و پێناسەی کلتووری لە سەرجادەوە هێناوە..

ئەو پزشکییە چی پێ دەکرێت کە کۆمەڵگا هەموو قیەمێکی دینی و ئەخلاقی و مرۆڤایەتی دۆڕاندووەو غەرقی ژیانی ماددی کردووە؟

ئایا زانست و تەکنۆلۆژیایی ڕۆژئاوا دەتوانێت خێزانەکان بپارێزێت؟

توانی ژیانی خێزانی بهێڵێتەوە؟

توانای خێزانەکان لە یەك نزیك بکاتەوە؟

توانای سۆزو ڕەحم و بەزەیی لە نێوان مرۆڤەکاندا دروست بکات؟

توانی خێزانێکی بتەو تۆکمە دروست بکات؟

توانی خزمایەتی بهێڵێتەوە؟

توانای ڕێگە بە ستەم بگرێت؟

توانی چارەسەرێك بۆ ئەو هەموو مرۆڤە کە ژمارەیان ناژمێرێت لە نەخۆشی دەروونی و بێزاری و خەمۆکی بدۆزێتەوە؟

توانای مرۆڤەکان لە بێزاری و نائومێدی ڕزگار بکات ؟

توانی مرۆڤەکان لە خۆکوشتن خۆهەڵدێران و خۆخنکان نەجات بدات ؟

بێ گومان نەخێر .........کەواتە ئەگەر ئەوان خۆیان بە شتێك با دەکەن و فڕو فیشاڵ دەکەن و شتەکەش بەرهەمی ئەوان نییە و نەیتوانیوە لەو هەموو نەهامەتی و نەگبەتییە بیانپارێزێت ، بۆچی خۆیانی پێ با دەکەن و خەڵکانی تریش ی پێ دەخەڵەتێنن؟!

بیرمەندی ئەڵمانی موراد هۆفمان کە سکرتێری پەیمانی ناتۆو سەفیری وولاتەکەی بوو لە مەغریب (چەند ساڵێکە موسوڵمان بووە) دەڵێت: (با هەموو پێکەوە سەرنجێك بدەینە قوربانیانی ئەو کۆمەڵگە پیشەسازیی و قیەمە بێ لایەنیەی کە ڕۆژئاوا لاف و گەزافی پێوە لێ دەدات.. هەرچی بۆ سەربەستی پێویست بێت هەیانە، هەرچی لە ژیاندا پێویستە بۆیان دەستەبەر کراوە، هەرچییان دەوێت ـ لە بێشکەوە تا گۆڕ ـ

بۆیان دابین کراوە: ئازادی، بەرەڵایی، بە شێوەیەکی وا کە نە سنووری هەیە نە لێپێچینەوە، نە حەرامی هەیە نە قەدەغە! مادده هۆشبەرەکان بە پێی داواکاریی، بە پێی میزاج، بە پێی کات و شوێن، لەبەر دەستی هەمووواندا هەیەو هەر کەس بیەوێت بە ئاسانی بۆی دێننە ماڵەوە، کاتی کارو کاتی حەوانەوەو سەیران و پشوو وەرگرتن و گەشت و ئاهەنگ و مۆڵەت وەرگرتن هەمووی بە پێی یاسا مسۆگەرە.. هەموو مافە مەدەنیەکان کە خەڵکی خەونیان پێوە دەبینێت، لێرە لە سەر سەرە، لە سەر چاوە، لە لیستی داخوازییدایە! کەچی لەگەڵ ئەم هەموو جوانیانەشدا ئەم خەڵکە هەست بە فەراغ دەکەن، هەست بە دەستبەتاڵیی دەکەن! بەلام هیچیان پێ نیە ژیانەکەی پێ پڕ کەنەوە، هیچیان نیە بۆی بژین! شەیدای باوەشێکی سۆزن، شەیدای فەزایەکی ئاە دانەوەن، بە کۆمەڵ تاسووقی ژیانێکی کۆمەڵایەتی نوێن لە ناویدا بژین و خۆ بدۆزنەوە، لە کۆمەڵگەکەی خۆیاندا بێت، یان لە کۆمەڵگەیەکی تردا.. هەموو عەوداڵی دەسەڵاتێکی رێبەرێکی رۆحین.. لە پشت هەموانیشەوە پرسیارێك پاڵ دەنێت: کوا نرخ و مانای ئەم ژیانەتان؟!) (موراد هۆفمان: الاسلام هو البدیل ل 29 )

پێشتر هەندێك بەڵگەمان هێنایەوە لە سەر مێژووی ئیسلامی کە بەشداریی زانایانی ئەم ئوممەتەی لە هەموو بوارەکانی شارستانێتیدا تۆمار کردووە.. بەرهەمی زانایانی ئیسلام لە هەموو بوارەکانی ژیاندا خزمەتی مرۆڤایەتی کردووە.. لە تەکنۆلۆژیای سەردەمی خۆیانەوە بۆ پزیشکی بۆ ئیدارەو ئاوەدانی، بۆ هونەرو ئەدەب و هەموو بوارەکانی کاروباری کۆمەڵگەی مەدەنی.. مێژوو شایەتە کە سەردەمانێك بوو هەموو پایتەختێکی ئیمارات و وولاتی ئەم ئوممەتە مۆزەخانەی زیندووانەی نێو دەوڵەتی بوو! هەر کەس لە رۆژهەلات و رۆژئاوا لە هەر بوارێکدا پسپۆڕو رێنیشاندانی دەوویست لەسەر مەسرووفی ئەوقاف بۆی موتەفەڕیغ دەبوو..

ۆڵ دیورانت دەڵێ: ( لە سەدەی دەیەمی زاییندا ئەو پارچە زەویەی نێوان بوخاراو سەمەرقەند یەکێك بوو لە چوار بەهەشتەکەی سەر زەوی، سیانەکەی تریش بریتی بوون لە وولاتی فارس و باشووری عێراق و هەرێمەکانی دەوروبەری دیمەشق لە وولاتی شام)! هەروەها دەڵێت :عەرەبەکان لە ئاستێکی زۆر بەرزی ئەندازیاریی و هونەرییدا بوون، شایەتی ئەمەش ئەو سەعاتە ئاوییەیە کە خەلیفە هاروونە رەشید پێشکەش بە شارلمانی ئیمپراتۆری کرد، کە لە پێستەو مسی زەردی نەخشێنراو دروست کرابوو، لە سەری هەموو سەعاتێکدا زۆر بە دیققەت دەرگایەك دەکرایەوەو بە قەدەر ژمارەی داواکراوی کاتەکە تۆپی بچووك دەکەوتە خوارەوە بە ژمارەی تۆپەکان دەزانرا سەعات چەندە، دوای کەمێك هەر لە خۆوە تۆپەکان دەچوونەوە جێیەکی ترو دەرگاکە تا سەعاتێکی تر دادەخرایەوە !..

ئاوبراو بەردەوامەو دەڵێ :

ئاسیای رۆژئاوا لەژێر دەستی موسوڵمانانادا گەیشتبووە ئاستێکی وا کە ئەوپەڕی کامەرانی و بەختەوەریی بە خەڵکەکەوە دیار بوو، پێشکەوتنی پیشەسازیی و بازرگانی لە لوتکەیدا بوو، ئەوەی ئەوانە لەو سەردەمەدا پێی کەیشتبوون ، ڕۆژئاوا دوای سەدەی شازدە پێی گەیشت (قصة الحضارة ب13 ل 107-108) واتە دوای شەش سەد ساڵ!!

مەدەنییەت لە کۆمەڵگەی ئیسلامیدا خرابووە خزمەت مرۆڤایەتیەوە نەك خزمەت ریشەکێش کردنی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی یان ئیستیعمار کردن و زەلیل کردنی گەلان.. ئەوەش دیدو هەڵوێستێکە دەیان شایەتی دەرەکی هەیە کە شایەتی بۆ دەدەن.. خاتوو (زیگرید هۆنکە)ی فەیلەسووفی ئەڵمانی لە باسی ئەوەی کۆمەڵگەی مەدەنی لەو سەردەمەی حوکمی ئیسلامیدا دەیکرد، دەڵێت :

(کارێکی فریاخوازیی و رزگارییانەی مەزن بوو، مانایەکی زۆر گەورەی لە مێژووی هەموو جیهاندا هەیە).. (ول دیورانت: قصة الحضارة ب1 ل 11 ی پێرستەکەی)!...زانایانی رۆژئاوا خۆیان شایەتی ئەوە دەدەن کە ئەو زانست و تەکنۆلۆژیایەی ئەمڕۆ لە دنیادا باوە، زۆرینەی بناغەو بونیادی هەر لەو تەکنۆلۆژیاو زانستانەوە هاتووە کە لەسەردەمانی پێشکەوتنە ئیسلامیەکەدا دامەزراو پێشبوردی کرد، لە هەموو بوارەکانی پزیشکی و فیزیاو کیمیاو ئەندازیاریی و لایەنەکانی تر ..

زیگرید هۆنکە لەو بارەشەوە دەڵێ :

(موسوڵمانان جوانترین دیارییان پێشکەش بە مرۆڤایەتی کرد، کە بریتیە لە شێوازی زانستیانەی دروست، (لە لێکۆڵینەوەو توێژینەوەو بەدواداچووندا)، ئەمەش رێی بۆ رۆژئاوا خۆش کرد بکەوێتە دۆزینەوەو داهێنان و زانینی نهێنیەکانی سروشت و کۆنترۆڵ کردنی). (ول دیورانت: قصة الحضارة ب1 ل 11 ی پێرستەکەی).

دێورانت دەڵێ: (کاتێك رۆجەر بێکن ئەم شێوازو رێبازەی بۆ ئەوروپا راگەیاند، کە پێش پێنج سەد ساڵ لەوەو پێش جابری کوڕی حەییان رایگەیاندبوو، بوو بە رێرەوێك بەرەو ئەو نوورەی عەرەبەکانی ئەندەلوس کردبوویانە مایەی روناکی.. ئەو نورەش بەشێك بوو لەو سەرچاوە نوورو روناکیەی موسوڵمانان لە رۆژهەڵات بڵاویان کردبۆوە)..( قصة الحضارة 292/13).

مامۆستا محمد ئەسەد دەڵێ :

(ئەم راپەڕینەی رۆژئاواو زیندووکردنەوەی بوارەکانی زانست و هونەر، هەمووی بە هۆی ئەو پەیوەندییە راستەوخۆیەوە بوو کە رۆژئاواو رۆژهەڵات لە سەردەمانی پرشنگدانەوەی جیهانی ئیسلامیدا هەیانبوو، ئەوروپا زیاتر سوودی لە جیهانی ئیسلامی دەکرد، بەڵام لەبەر سپڵەیی و ئەمەکنەناسی خۆی ئیعتیراف بەو فەزڵ و پیاوەتیە ناکات).. ( الاسلام علی مفترق الطرق ل 59)

نا ئەم شۆڕشە تەکنۆلۆژییەی کە سەدەی بیستەم بە خۆیەوە دیووە، لە دۆزینەوەی ئەتۆم و رەفتار کردنی لەگەڵییدا، بۆ دۆزینەوەی نهێنیەکانی ئاسمان و پێکهاتەی نویی خوێن و پلازما، هەمووی رەنجی شارستانێتی ئەوروپا نیە، نا....نا....نا....بەو شێوەیە نییە با کەس خۆی گێل و گەواڵ و گەمژە نەکات ...... ئەوە شارایەکی کۆکراوەی مەڵۆی رەنج و زانیاری و دۆزینەوەو داهێنان و تیۆرو پێناسەو رێسای لێکۆڵینەوەو تیانووسی سەدان ساڵەی مرۆڤایەتیە.. ئەو خەرمانە کۆکراوەیە هەبوو، چاوەڕێی ئەقڵیەتێکی شارستانێتی دەکرد شەن و کەوی کات، ئیتر خۆو بەخت کەوتە بەر دەست شارستانێتی رۆژئاوا...... بە کوردی نێچیرەکە کەوتە ڕاوی ئەوان و بە ئاسانی خۆیان کرد بە

خاوەنی ....... بەڵگەی ئەمەش فیکرەو دەوڵەتەکەی کۆمۆنیستانە، کە پربوو لە بەرەی دژایەتی رۆژئاوا، بەڵام توانی لە سەردەمانی دەسەڵاتی خۆیدا لە یەکێتی سۆڤیەت بێ هاوکاری رۆژئاوا، ئەو پێشکەوتنە زانستی و تەکنۆلۆژیایە بهێنێتە دی کە رۆژئاوا هەیەتی.. ئەگەر ئەو دیدە فەلسەفیە لێڵەی نەبوایە کە ئەو پەیوەندییە ئاڵۆزە قورسەی لە نێوان دەوڵەت و کۆمەڵگەدا دروست کرد، ئێستا شان بە شانی شارستانێتی رۆژئاوا دەڕۆیشت و لەو بوارانەیدا کە پێش ئەوروپا کەوتبۆوە بەهێزتریش دەبوو.. چونکە ئەویش وەکو ئەوروپا ئەو رەنجە کۆکراوەی زانست و داهێنانەی مێژووی لەبەر دەستدا بوو.. بۆیە ئومێد هەیە کە شارستانێتی ئیسلامیش جارێکی تر بێتەوە مایەو دوای ئەوەی ئوممەتەکەی دێتەوە کایە، ئەویش دەتوانێت بێتەوە گۆڕەپانی کێبڕکێ ان شاء الله.. ئەوجا مرۆڤایەتی نموونەی ئەویش بە واقیعی دەبینێتەوە.. هەر چەند فەزڵ و ماندو بوونەکەی بۆ ئومەتتی ئیسلامی دەگەڕێتەوە بەڵام ڕۆژئاواو قەشەو کڵێساو مولحیدو عەلمانییەت لە بیری خەڵکیان بردووەتەوە بە تەم و مژاوی کردن و دروستکردنی گومان و.......

گەلانی رۆژئاوا ئێستا وا بۆیان روون دەبێتەوە کە زۆر لایەنی ئەم شارستانێتیەی بە سەریانەوەیە هۆکاریی پشێویی و سەرگەردانی و بێ روحمییانە، چونکە بێ هودە کەوتوونەتە دوای تەراوێلکە (سەراب)...

کۆمۆنیستی کە تەمەنی کورت و پشووی کورتتر بوو، شارستانێتیەکەی وا زوو داڕماو لە ماوەی چاوتروکانێکدا تەپوتۆز لە بیروباوەڕەکەشی هەستا نەك هەر لە سیستم و دەوڵەت و تیۆرو کۆمەڵگەکەی!! شارستانێتی کۆمۆنیست یەکەمین شارستانێتی مرۆڤایەتیە کە تەمەنی ئەوەندە کورت بێت، چونکە دیدو تێروانینە فەلسەفیەکەی زۆر دژی سروشتی مرۆڤ بوو، دەوڵەتەکەی لەسەر بتپەرستی تاقە حزب دامەزراند بوو، دەوڵەتیش بە عەسکەریتاریای تاقە حزب بووبوو بە دوژمنی یەکەمی کۆمەڵگەکە !

ئەوە لە بەر ئەوە بوو کە ئەقڵی هەموو کۆمەڵگەکەی خۆی ئیلغا کردبووە بۆ ئەقڵی لینین و بازووی ستالین! بەڵگەنەوویستی دیدو تێروانینەکانی تری بە کاوبا دەهاتە پێش چاو !

دەیووت ماوەیەکی تر هەموو گەلانی ئەوروپا بە پێشەوایەتی کرێکاران رادەپەڕن و سەرمایەداریی را دەدەن !!

نەیدەزانی کە ئەمە گۆرانی تەنیایی ناو ئەشکەوتی چۆڵەوانیە، چونکە سەرمایەداریی توانی کرێکارانیش ئیحتیوا بکات، سەرمایەداریی رێی دا لە ناو هەناویدا حیزبی کۆمۆنیستیش دروست ببێت بێ ئەوەی لە هیچ شوێنێك بتوانێت ساڵێك بێتە سەر حوکم !

کۆمۆنیستی بە زۆرو بە داپڵۆسان لە ناو نەچوو بەڵکو لە کەشوهەوایەکی ئازادی و سەربەستی ئەوروپا مرد ، نە بە شۆڕش هاتە پێشەوە نە بە کۆدەتای سەربازیی، نە بە خۆپیشاندانی کرێکاران و شاڵاوی جەماوەریی!

حزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی لە گەرمەی ئیدیعایاتی خۆیدا بوو، کەف پەڕیبووە لا لغاوەی، یان بە کوردی سەرقڵایی (کەف پەڕی بو لە کەلاوەی) ، کاتێکیان زانی چەکوشەکە درا بە سەریداو کەوت! جەماوەری گەلانی ژێر دەستەی رووسیش بە داسەکە سەریان لێکردەوە!

ئەم شارستانێتیە سەرمایەدارییەش کە رۆژئاوای خستۆتە ژێر رکێفی هەر بەو چارەنووسە دەگات.. ئێستا ژەهرێك بە خوێن و هۆرمۆنی جەستەیدا تەشەنە دەکات، بێ ئەوەی هەستی پێ بکات، یان گوێی بداتێ، یان بیوەستێنێت، یان هەوڵی چارەسەرکردنی بدات کە کەم کردنەوەی چاوچنۆکیی و دزیی و گزیی سەرمایەداریی و کۆمپانیا زەبەللاحەکانە.. ئەمیش بەرەو مەرگێکی ناکاو ملی لێناوەو کەم لە بیرمەندانیان هەستی پێ دەکەن و هاوار دەکەن، بەڵام کێ لە قەڵاو قوللەی حوکمڕانیی و لووت بەرزی دەسەڵاتەوە گوێیان لێ دەگرێت..

بریجنسکی راوێژکاری جیمی کارتەری سەرۆکی ساڵانی 1979 ی ئەمریکا داوا لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەکات و دەڵێ :

(با بەرپرسانی ئەم ووڵاتە پێداچوونەوەیەکی ووردو گشتگیر بەو دیدە فەلسەفیەدا بکەنەوە کە ئەم شارستانێتیەی لە سەر دامەزراوە، با شارستانێتیەکەو دەرچەکانی بخەنەوە ژێر رەخنەی زاتی جیددییەوە، ئەمریکا دەبێت بێتە سەر ئەو قەناعەتەی کە ئەو ئەو کۆمەڵگەیەی خاوەنی قیەم و دیدو پێناسەی نەگۆڕ نیەو هەموو دیدو پێناسەیەکی بریتیە لە تێرکردنی حەزەکان، ئەوە کۆمەڵگەیەکە هۆکاریی داڕمانی لە ناخییدا هەڵگرتووە،ئەوە کۆمەڵگەیەکە سبەی دەتوێتەوە.. ئەمریکا دەبێت پەندو ئامۆژگاریی لە گەشانەوەو پووکانەوەی شارستانێتیەکانی پێش خۆی وەرگرێت، چونکە مێژوو فێری کردووین کە هەموو هێزێکی مەزنی دەبێت پەیامێکی شارستانێتی پێ بێت، کە لە پارسەنگی رەوشت بەرزیی و جوامێرییەوە هاتبێت، تا ببێتە ئەو نموونەی بە سەربەستیەوە چاوی لێ دەکرێت و شوێن پێی هەڵدەگیرێت، نەك بە زۆری شان و بازوو بدرێت بەسەر میللەتاندا.. بە بێ ئەم پەیامە شارستانێتیە دەبینرێت میللەتان شارستانێتی ئەمریکایی رەفز دەکەنەوە هەر وەکو کە شارستانێتی کۆمۆنیستیان رەفز کردەوە..). (گۆڤاری الوعی ژمارە 86 ل 25)

بەڵام ئێمەی موسوڵمان، لە روانگەی باوەڕو یەقینمان بەو ئایەتەوە کە خوای گەورە تێیدا دەفەرموێت :

(وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَاكُمْ أُمَّةً وَسَطًا لِّتَكُونُواْ شُهَدَاء عَلَى النَّاسِ وَيَكُونَ الرَّسُولُ عَلَيْكُمْ شَهِيدًا) البقره/143.

واتە: ئە ئاوا ئێمە ئێوەمان کردووە بە ئوممەتێکی دادپەروەرتا ببنە شاهید لەسەر خەڵکیی و پێغەمبەرەکەی صلی الله علیه وسلم خواش ببێتەوە بە شاهید لەسەر ئێوە ..

لەوە دڵنیاین کە ئەو کۆمەڵگەی مرۆڤایەتییە هەر لەو بشێوی و سەرگەردانیەیدا دەبێت ، هەر لەو کێشەو تەنگژە مەسیرییانەیدا دەبێت تا ئەو کاتەی ئوممەتی موسوڵمان شارستانێتیەکەی ئیسلام سەر لە نوێ دێنێتەوە کایەوەوو دەیکاتەوە بە هۆکاری گەیاندنی پەیامی ئیسلامەتی بە هەموو جیهان، زیاتر لەوەی ئومێدی بۆ دەخوازێت کە شارستانێتی ووڵاتەکەی ئەو بیهێنێتە دی ..

جا کە شارستانێتی ئیسلامی هاتەوە کایەو کۆمەڵگەکەی خۆی بە نان و ئەمان و پێشکەوتنەوە ئاراستە کردو شەریعەتەکەی خوای کردەوە بە مەرجەعییەتی دەستووری یاساکانی و پەیامەکەی خۆی نیشان مرۆڤایەتی دایەوە، ئەو کاتە دەبینیت چۆن خەڵکی وەکو زەمانی دوای فەتحی مەککە (يَدْخُلُونَ فِي دِينِ اللَّهِ أَفْوَاجًا) سورەتی النصر/2.

**واته: به كۆمه‌ڵ كۆمه‌ڵ دێنه ناو ئه‌م دینه‌ی خواوه ..**

**ده‌بێت ئه‌وه‌ش باش بزانین ، ئه‌مه به خه‌یاڵ ناهێنرێته‌وه كایه، ئه‌مه پێش هه‌موو شتێك ئه‌وه ده‌خوازێت موسوڵمانان سه‌ر له نوێ ژیانێكی ئیسلامی ده‌ست پێ بكه‌نه‌وه، ده‌بێ سه‌ره‌تا كۆمه‌ڵگه‌ی موسوڵمان پێك بهێننه‌وه، ئه‌و كۆمه‌ڵگه‌یه‌ی كه ئیسلامه‌كه‌ی وه‌رگرتووه‌و قبووڵێتی، ئه‌و كۆمه‌ڵگه‌یه‌ی ئیسلامی وه‌كو عه‌قیده‌و سیستمی ژیان و ئاراسته‌وانی كۆمه‌ڵگه‌و ده‌وڵه‌ت قبووڵه، دوای ئه‌م هه‌نگاوانه، دوای هێنانه‌وه‌ی ئه‌م كۆمه‌ڵگه‌و ده‌وڵه‌ته ده‌توانرێت به ئاسانی په‌یامی ئیسلامی به هه‌موو جیهان بگه‌یێنرێت..**

**خوای په‌روه‌ردگار ده‌فه‌رموێ: (وَعَدَ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنكُمْ وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَيَسْتَخْلِفَنَّهُم فِي الأَرْضِ كَمَا اسْتَخْلَفَ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ وَلَيُمَكِّنَنَّ لَهُمْ دِينَهُمُ الَّذِي ارْتَضَى لَهُمْ وَلَيُبَدِّلَنَّهُم مِّن بَعْدِ خَوْفِهِمْ أَمْنًا يَعْبُدُونَنِي لا يُشْرِكُونَ بِي شَيْئًا وَمَن كَفَرَ بَعْدَ ذَلِكَ فَأُولَئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ) النور/55.**

**واته: خوای گه‌وره به‌ڵێنی به موسوڵمانان داوه، به‌وانه‌تان كه باوه‌ڕیان هێناوه‌و كرده‌وه‌ی چاكه ده‌كه‌نه پیشه‌ی خۆیان، كه بیانكاته جێنشینی سه‌ر زه‌وی و ده‌سه‌ڵاتی حوكمیان پێ بگه‌یێنێت، هه‌ر وه‌كو كه به پێشینانی ئێوه‌ی گه‌یاند، دینه‌كه‌شتان كه خوا خۆی پێی رازیی بووه بۆتان ده‌گه‌یێنێته‌وه پله‌ی سه‌روه‌ریی و ئه‌و ترس و تۆقینه‌ی له‌سه‌ریشتانه بۆتان ده‌كات به هێمنیی و ئه‌مان.. به‌و مه‌رجه‌ی ته‌نها من بپه‌رستن و شه‌ریكم بۆ بڕیار نه‌ده‌ن! ئه‌وی دوای ئه‌وه كافر ببێت، ئه‌وه خۆی به سه‌ربه‌ستی خۆی له ڕێ ده‌رچووه..**

**ئه‌و داڕمانه‌ی تووشی جیهانی ئیسلامی بووه، هه‌ر به سه‌رنجدانێكی سه‌رپێیی خێراش ئه‌وه روون ده‌بێته‌وه كه دواكه‌وتن وبه‌زینی موسوڵمانان له مه‌بده‌ئه‌كه‌یاندا نیه، نا .. عه‌قیده‌ی مسوڵمانان عه‌قیده‌یه‌كی راست و دروسته، له‌گه‌ڵ سروشتی مرۆڤ و ژیانی گه‌ردوونیدا یه‌ك ده‌گرێته‌وه، له‌گه‌ڵ هه‌موو ژیرییه‌كی ساغدا دێته‌وه.. پێناسه‌ی ئیسلام بۆ گه‌ردوون و ژیان و مرۆڤ، بۆ پێكهاته‌و چاره‌نووسیان له‌گه‌ڵ حه‌قیقه‌تی ئه‌مانه‌دا یه‌ك ده‌گرێته‌وه.. ئه‌و سیستمه سیاسییه‌ی له‌سه‌ر ئه‌م عه‌قیده‌ش داده‌مه‌زرێت هه‌ر راست و دروسته.. جگه له‌وه‌ی سیستمێكه له سه‌ره‌تایه‌وه له‌ژێر ئاڕاسته‌ی وه‌حیی خواییدا دامه‌زرا، بۆ چاره‌سه‌ری كێشه‌ی كۆمه‌ڵگه‌كه‌ی خۆی دامه‌زرا، كه كۆمه‌ڵگه‌یه‌كی مرۆڤایه‌تی بوو، له كات وشوێنی دیاری كراویدا سه‌رپه‌رشتی كرد، كۆمه‌ڵگه موسوڵمانه‌كه كۆمه‌ڵگه‌یه‌كی به‌شه‌ریی بوو، بۆیه ده‌شێت ئه‌م سیستمه له هه‌موو كات و شوێنێكی تری گونجاودا بۆ كۆمه‌ڵگه‌یه‌كی تری به‌شه‌ریی دابمه‌زرێته‌وه‌و له‌ژێر سایه‌ی هه‌مان دادو ئه‌ماندا كۆمه‌ڵگه‌كه‌ی ئاڕاسته بكاته‌وه.. ئه‌و داڕمان و شكسته‌ی تووشی موسوڵمانان بووه له كه‌مته‌رخه‌میی خۆیاندایه ده‌رهه‌ق به تێگه‌یشتن له ئیسلام و پێوه پابه‌ندبوون و چۆنیه‌تی چه‌سپاندنی مه‌بده‌ئه‌كه‌ی..**

**با ئه‌وه‌ش باش بزانین ،مه‌بده‌ء ده‌رمانێكی سیحریی نیه كاریگه‌ریی خه‌یاڵپلاوانه پێشكه‌ش كات !**

کاریگەریی مەبدەء لەوێوە دێت کە کۆمەڵێك مرۆڤی سەرڕاست بە شێوەیەکی ڕاست و دروست و جیددی وەری دەگرن، بە ژیرییان لێی حاڵی دەبن، لە ناخیاندا قەناعەتی پێ دەکەن، لە ناو خۆیاندا بە شێوەیەکی جوان و پاك دەیچەسپێنن، کۆمەڵکاریی و کۆمەڵگەی خۆیانی لەسەر دادەمەزرێنن.. ئاوا موسوڵمانان دەتوانن بێنەوە کایەی کاریگەریی..

ئوممەتی ئیسلام کاتێك دارماو تووشی شکست بوو کە ڕێی شل کرد بۆ گۆڕینی خیلافەت بۆ پاشایەتی، کاتێك دەرگای ئیجتیهادی بە ڕووی زانایاندا داخست و بایەخی سەرەتایی لە زمانی عەرەبی سەندەوە! بەمانە خۆی گەیاندە بنبەست.. نەیتوانی لەوێوە هەنگاو هەڵهێنێتەوە بەرەو جۆرو شێوازە بەردەوامەکانی گۆڕانکاریی و ڕاپەڕین.. گومانی تێدا نیە کە ئیجتیهادو زمانی عەرەبی دوو هۆکاری سەرەکین لە تێگەیشتنی ئیسلام و ڕاست چەسپاندنی.. ئەمانە نەمان، ئیدی قەڵا فیکرییەکەی کە لەسەر عەقیدە بەهێزەکەی دامەزرابوو، نۆژەن کردنەوەی نەماو ووردە ووردە دادەڕوخا !

لە هەموو لایەنێکیەوە ئیهمال کرا، لەو کاتەشدا شارستانێتی ئەوروپایی کە لەسەر مەبدەئی سەرمایەداریی چاوچنۆکی دامەزرابوو ئەو لاوازییەی ئوممەتی ئیسلامی بینی و هەلی زێڕینی بۆ ڕەخسا کە پەلاماری جیهانی ئیسلامی بدات، بۆیە خێرا هەلی قۆستەوەو هەموو لایەکی خستە ژێر چەپۆکی خۆی!

سەیر ئەوەیە موسوڵمانان لە هەڵە حاڵیی بوونیان لە ئیسلامەکەو لە ماهییەتی ئیستیعماری سەرمایەداریی وایان دەزانی داگیرکەران هاتوون تا ڕێی مەعریفییان فێر کەن، ڕێی ڕاپەڕین و هەستانەوەی شارستانێتییان نیشان دەن! هۆشیان بۆ لای ئەوە نەچوو کە بیروباوەڕو دیدو تێڕوانینی داگیرکەران ـ هەر لە بناغەو دەسپێکەوە ـ پێچەوانەی عەقیدەی موسوڵمانانەو ئەوان نەك هەر مەبدەئی خۆیان ناگۆڕن بەڵکو بە زۆر عەقیدەو دیدی دینی موسوڵمانان و غەیری موسوڵمانانیش بۆ ئەوەی خۆیان دەگۆڕن..

جا لەو ڕوانگەوە کە خوای گەورە بڕیاری داوە کە :

(إِنَّ اللّهَ لاَ يُغَيِّرُ مَا بِقَوْمٍ حَتَّى يُغَيِّرُواْ مَا بِأَنْفُسِهِمْ) الرعد/11.

واتە: ئەوە ناگۆڕێت کە لە ناو میللەتێکدا هەیە، تا خۆیان نەیگۆڕن ..

موسوڵمانانی ئەم سەردەمەش داوای ئەوەیان لێ دەکرێت کە سەر لە نوێ دیراسەی ئیسلام بکەنەوەو لە سەرچاوە پاکەکانی خۆیەوە وەریبگرنەوە، سەربەستانەو دوور لە هەموو کاریگەریی دیدو پێناسەو ڕێسایەك کە سەردەمانی بیرکولی موسوڵمانان دروستی کردبێت، هەروەها دوور لە دیدو پێناسەو ڕێسای سەردەمی ئیستیعمارو ژێردەستەیی عەسکەریتاریای ڕۆژئاواو شاڵاوە فیکریەکەی.. پێویستە لەوەی نوێ ئازادانە ئیسلامەکە وەرگرێتەوەو خۆی و دەوروبەریی بە ئاڕاستەی ئیسلامەکە پەروەردە بکاتەوەو هەوڵ بدات کۆمەڵگەو سیستەمە

ئیسلامیەکە دامەزرێنێتەوە.. تا سەر لە نوێ کۆمەڵگەو دەوڵەتی ئیسلام ببنەوە بە منارەی رێنیشاندان و سونبولی هێمنیی و ئەمان بۆ هەموو مرۆڤایەتی.. خوای گەورەش بریاری داوە کە :

(إِنَّ الأَرْضَ لِلَّهِ يُورِثُهَا مَن يَشَاء مِنْ عِبَادِهِ وَالْعَاقِبَةُ لِلْمُتَّقِينَ) واتە: زەوی موڵکی خوایە، دەیبەخشێت بە هەر بەندەیەکی کە خۆی بیەوێت، چارەنووسیش بۆ تەقواکارو دیندارانی سەرڕاستە..

ئەگەر ئەمڕۆش بە جوانی سەرنجێکی جیهانی بە ناو ئیسلامی بدەین بە جوانی بۆمان دەردەکەوێت کە هێشتا لەو ئاستە نین ئەم ئایەتە شمولمان بکات ، واتە جارێ ماومانە دەبێت سەرشۆرو زەلیل و ژێردەستە بین و لە بەر ئەوەی پیشتمان لە ڕێگە ڕاستەکە کردووەو بە ناتەواوی وەرمان گرتووەو بۆ بەرژەوەندی و چاولێکەری و بژێوی ژیان هەندێك دێمەنی ڕەواڵەتی ئیسلامیمان پێوە دیارە ، ئەگینا لە ناخ و ناوەڕۆکدا دڕندەو دزو تاڵانکەرو دین فرۆش و خۆفرۆشین ، بە ناوی جۆارو جۆرەو موحارەبەی شەریعەتەکەمان دەکرێت و بێ دەنگ دەبین ، یان نەك هەر بێدەنگ دەبین جارو باریش ئەشەوبیلایان بۆ دەکێشین و دەڵێین ڕاست دەکەن ، ئەمەیە جەهلی مورەکەب ، کە زۆر زەحمەتە بەم زوانە ڕاپەڕین و فرت و فێڵ و گومانی سیکۆلاریزمەکان فڕێ بدەین و چیتر بە گومان و چەواشەکاریەکانیان نەخەڵەتێین و تێیان هەڵبدەین.......

ئەوەی ئەمڕۆ لە جیهانی بە ناو ئیسلامیدا یان لە جیهانی سەرۆك کافرو بێ باوەڕو جەماوەر موسوڵماندا دەیبینین ، عەقڵی مرۆڤی ئیماندارو ژیرو بە ئینساف دەتەزێنێت ، هەر لە کوشتن و برین و دزی و جەردەو تاڵان و درۆو فرت و فێڵەوە بگرە تاکو ئەو شتانەی خوای مەزن نەفرەتی لێ دەکات هەمووی کاڵاو ئاڵای ڕۆژانەیەو خەڵك پییەوە سەرقاڵەو مزگەوتەکانیش قەرەباڵغە!...........

بە ڕاستی سەیرو سەمەرو سەرسوڕهێنەرە ، لە یەك کاتدا هەم زاڵم بیت و عادل ، هەم نوێژکەر بیت و هەم زیناکەرو عەرەقخۆرو داوێن پیس ، هەم ئیسلامی بیت و هەم عەلمانی ، هەم وڵات و نیشتیمان پەرەست بیت و هەم خواپەرەست ، هەم پشتیوانی لە ئیسلام بکەیت و هەم عەلمانی، لە گەڵ موسوڵمان بجەنگیت و حەجی ماڵی خوا بکەیت و نوێژ بکەیت ، باوەڕت بە قورئان بیت و پەیڕەوی دیمۆکراسی بکەیت ، بە ڕاستی زۆر سەیرەو مرۆڤی ژێر سەرگەران دەبێت لەم تێکەڵ و پێکەڵە ، لەم خۆ گێج و گەمژە کردنە ، لەم خۆدزینەوەو............هتید!!! ئەم بابەتە بە ناونیشانی :تەکنۆلۆژیای سەردەمی (بۆگەنبوونی مێژوو)لە بەڕێز ئەحمەد ناری وەرم گرتووە ، بە دەستکاری و زیادو کەم کردنی خۆمەوە...

## بۆچی موسڵمانانی ئەمڕۆ لە بواری تەکنەلۆجیادا داهێنانیان نییە؟
## بەشی دووەم

لە ڕاستیدا ئەم پرسیارە کەسێکی نەخۆش و نزم و بێ ئاگا لە زانست و تەکنەلۆجیاو مێژوو سەردەم دەیکات ، لە بەر ئەوە دەبێت ئەم پرسیارە لە کاتێکدا بکرێت کە ئیسلام و ئوممەتی ئیسلامی بە تەواوی و بە گشتگیری لە سەر کار بێت ، کاتێک کەسێکی مولحیدو یان عەلمانی ئەم پرسیارە دەکات ئەوە دەبێت هەموو موسڵمانێکی ژیر ئەوە بزانێت کە دەیەوێت دەستە چەورو ڕەشەکەی خۆی بە ئیسلام و موسڵماناندا بسڕێت ، لە بەر ئەوە دەبێت ئێمەی موسڵمان ئەو پرسیارە لەوان بکەین و بڵێین:

بۆچی ئێوەی عەلمانی کە کە فەرمانڕەواو حاکم و دەسەڵاتدارن و سەرجەم جومگەی وەڵات و ئابووری و کانگاو کانزاو سەرەوەت و سامانی وەڵاتان بە دەستەوەیەو هیچ داهێنانێکتان نییەو لە ئێمە دواکەوتووترن؟

ئەگەر ئێوەی عەلمانی مەجالی ئێمە بدەن و ساحەکەمان بۆ چۆڵ بکەن بێ گومان بن وەک سەدە زێرینەکانی ئیسلام سەدان داهێنان لە گشت بوارەکاندا دەکەین کە دواترو لە بابەتەکانیتردا بە بەڵگەوە بۆتان دەسەلمێنین!!....

ئەگەر بە قەوڵی ئێوە ئێمەی موسڵمان ئیسلام دوای خستووین و داهێنانمان نییە ، ئەی خۆ ئێوە نە موسڵمانن و نە پابەندن بە ئیسلامەوە ، ئەی بۆچی ئێوە لە ئێمە دواکەوتوترن؟!!

ئەی بۆچی حیزبەکەتان تاکو ئێستا لایلۆنی شوکولاتێک یان عەلاگەیەکی زەبڵی دروست نەکردووە؟

ئەی خۆ حیزبەکەتان حیزبێکی ئیسلامی نییەو فڕتان بە ئیسلامەوە نییەو بەردەوام بە ئیسلامدا هەڵدەوەڕن ، بۆچی تاکو ئێستا سەرە تەشیەکتان دروست نەکردووە؟

کەواتە ئەم پرسیارو گومان دروست کردنە ئێوە دروستی دەکەن ئەو پەڕەی نەفامی و گەمژەییە ، دەبێت ئێمەی موسڵمان لۆمەی ئێوەی عەلمانی و مولحید بکەین کە وەڵات و دەسەڵات بە دەستی ئێوەیەو تەنیا دزی و کزی دەکەن و تاکو ئێستا یەک داهێنانتان نەکردووە ، اشهد بالله داهێنانتان لە زۆر بواردا کردووە ، وەک : سوکایەتی بە ئیسلام و قورئان و پێرۆزیەکانی نەتەوەی کوردی موسڵمان ، یان وەک : دزی و تاڵان و فرت و فێڵ بە ناوی نەتەوەو نیشتیمانەوە ، یان وەک : بێ ئەخلاقی و بانگەشە کردن بۆ نێربازی و سۆزانیخانەو...و......و.......هتد . یان وەک : دروستکردنی گومان و درۆو دەلەسە بۆ ئەوەی موسڵمان تووشی گومان بکەن ، و زۆر شتیتر.........

لێرەدا دەمەوێت بە دیاریکراوی وەڵامی ئەو پرسیارە بدەمەوە ، بۆ چی موسڵمانان وەک ڕۆژئاواییەکان داهێنانیان نییەو هۆکار چییە؟

**لە بەر ئەوە لەم سەدەو سەردەمەدا بوونی دەوڵەتێکی ئیسلامی ڕاستەقینە نییەو تەنیا خەڵکەکە موسڵمانەو سەرجەم دەسەڵات و پەرلەمان و سەرۆک و کاربەدەستانی وەڵاتانی ڕۆژهەڵاتی بە ناو ئیسلامی عەلمانین و دەبێت ئەو پرسیارە لەوان بکرێت بۆچی داهێنانی تەکنەلۆجیایان نییەو لە موسڵمانە ژێر دەستەکان دواکەوتووترن؟**

**وەک هەموو لایەک دەزانین وڵاتانی بە ناو ئیسلامی ، یان تێکەڵ و پێکەڵ لە ئیسلامی و عەلمانی خاوەنی سامانی سروشتی وەک نەوت و غازو یۆرانیۆم و زۆر شتیترن ، دەسەڵاتە عەلمانیەکانیش زیاتر گرنگی بەو سامان و بەرهەمانە دەدەن بۆ ژیانی شاهانەی خۆیان و باسکردنی داهێنان و تەکنەلۆجیاو ئەو شتانە بە گاڵتە دەگرن و گرنگی بەو بوارە نادەن ، ئەوان دڵنیان ژیانیان مسۆگەرو شاهانەیەو هەموو عەیش و نۆشێکیان سازو مسۆگەرە ، ئیتر باسکردنی تەکنەلۆجیاو داهێنان و توێژینەوە زانستیەکان لای ئەوان کاو بایەو نرخی فلسێکی قەڵبی نییە.**

**ئەگەر مولحیدو عەلمانیەکان خۆیان گەمژە نەکەن بە جوانی دەزانن وەڵاتانی بە ناو ئیسلامی بە هۆی دەستتێوەردانی ڕۆژئاواییەکان بۆ ماوەی زیاتر لە سەد ساڵە کۆڵەواری کردوون و بەردەوام دەناڵێنن ، وەک ئەو هەموو کوشت و کوشتارە ئەوان دروستی دەکەن و بە هۆی کۆیلەو چڵکاوخۆرەکانی ناوخۆوە هەڵیدەگیرسێنن و ئەوانێش بە بروبیانووی درۆو ساختەوەو بە ناوی تیرۆرەوە داگیری دەکەن و هەرچی چەک و ئەسڵەحەی مۆدیل کۆنە پێیان دەفرۆشن و لە سەر ئەوان ساغی دەکەنەوە ، ئەگەر لە بیرتان بێت کاتێک ئەمریکا ئەفغانستانی داگیر کرد یەکەم شت سینەمای بۆ کردنەوە ، ئاخر خەڵکێکی ڕەش و ڕووت و برسی ، چۆن بتوانێت بە سکی برسییەوە تەماشای فیلمی سینەمای بکات؟**

**ئەوەی لە عیراق بە ناوی چەکی کیمیاییەوە کرا ، بە هەزاران لاپەرە تۆمار ناکرێت ، هەر بەو ناوەو خۆیان لە شارێکی وەک فەلوجە چەکی کیمایی و کیمیاییان بە کار هێناو کەسیش باسی نەکردن ، بە ناوی بەرنگاربوونەوەی تیرۆرە هەزاران کەسیان تیرۆر کردو هەزاران کارەساتی دڵتەزێنیان ئەنجامدا لەوانە : لە زیندانەکانی عیراق بە گشتی و لە فەلوجە بە تایبەتی ، یان سەربازە ئەمریکیەکان دەستدرێژی سێکسیان کردۆتە سەر منداڵە کوڕەکان لە پێش چاوی دایکیان لە زیندان دا ، ئەمەش لوتکەی وەحشیگەرییانە:**

**https://youtu.be/sWvTochEWGI**

**باوەڕ دەکەیت ئەم ئەمریکییە دەستدرێژی سێکسی دەکاتە سەر کچێکی موسڵمانی تەمەن چواردە ساڵ و دواتر بە دڕندەترین شێوە کچەکەو سەرجەم ئەندامانی خێزانەکە دەکوژێت؟**

**بەڵێ بەڕێزان کاتێک ئەم دڕندەو دەعبایە دەهێنن بۆ داگیر کردنی عیراق هەمان بیریان لە مێشکی ڕەشیان چەقاندوە کە باپیرانیان ئەمریکایان پی داگیر کرد و هیندیە سورەکانیان قڕ و قەتڵ و عام کرد ، ئەمەش سەرچاوە:**

**I-didn’t-think-Iraqis-humans-sa**

**http://www.dailymail.co.uk/.../I-didnt-think-Iraqis...**

**ئەگەر لەم بارەیەوە بەڵگە بێنینەوە ئەوە ماندوتان دەکەین ، هەر بۆیە دڵنیام مەگەر کەسێک خۆی بگەمژێنێت ئەگینا ڕوون و ئاشکرایە پیلانی ئەوان بۆ ئەو وەڵاتانە چی بووەو چۆن بووە!!.....**

**بە داخەوە لە لایەکەوە زۆرینەی موسڵمانان هەر یەکەو بە شێوەیەک مەشغوڵ کراوەو سەرقاڵی حیزبایەتین و ئەو سۆزو خۆشەویستییە بۆ حیزبەکەیان هەیانە بۆ ئیسلام و قورئان نییانە ، لە لایەکیترەوە هەندێک سەلەفی و هەندێک سۆفی و هەندێک دەرویش و هەندێک تێکەڵەیەک لە ئیسلامی و عەلمانی و هەندێک بێ لایەنن ، ئەمەش وای کردووە موسڵمانان یەک کیان و ئوممەت نەبن و پەرش و بەڵاو بوون و بە ئاسانی ڕاویان بکەن ، تەنیا ڕێژەیەکی فرە کەم بە ئیسلامی ڕاستییەوە سەرقاڵن ، ئەوانەش ئەوەندە پیلان و ئاژاوەو ئاوو ناتۆرەیان بۆ دروست کراوە ، ناتوانن وەک پێویست دەربکەون و گەشت و نمای خۆیان بکەن ، بە پروبیانووی درۆینە ، زۆربەیان لە کونجی زیندانەکاندان.....زۆر شتیتر.......**

**وەک هەموومان دەزانین سەرکردەی وەڵاتە بە ناو ئیسلامیەکان و حیزبە عەلمانیەکان ، هەموو عەلمانین و بیروباوەڕی عەلمانییەتیان هەیە ، ئەوان نایانەوێت دەرفەت بۆ گەنجەکان برەخسێنن و داهێنانیان هەبێت ، دەیانەوێت گەنجانی موسڵمان هەردەم مولتەزیمی ئەوان بن و چاویان لە دەستی ئەوان بێت و تەنیا ئاواتیان ئەوە بێت بتوانن خۆیان بژێنن ، ئەوان بە ئەنقەست خەڵک برسی دەکەن بۆ ئەوەی خەڵک ناچار بێت کلکە لەقەیان بۆ بکات و چاویان لە شوێنی ئەوان بێت ، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ نەبوونی ئاگاییی پێویست و تێنەگەیشتن لە ئیسلام و ژیانی سەردەم و دەوروبەر ، کاتێک گەنج بە ئەنقەست و بە پیلان ئەو بەڵاو تەنگەژەو بێ دەرەتانی و بێ کاری و بێ پارەییە بە سەردا سەپێنرا ، ئیتر کام داهێنان بکات؟!!!**

**لە وڵاتی بە ناو ئیسلامی ڕێخراوو سەنتەرو شەڵتەرو باندو دەستە دروست بووە بۆ لە خشتە بردنی گەنجان ، ئەمەش بە هۆی کەناڵی تایبەت و سەرقاڵکردنی گەنجان بە گۆرانی و فیلم و ڕەقس و دانس و سەماو عەرەق و مەساج و قومارخانەو یاری و گەمە ئۆنلاینەکانەوە زۆر شتیتر ، ئەمەش بە ناوو لە ژێر ناوی ئازادی و سەربەستی و هونەرو هونەرمەندو پێشکەوتن ، کاتێک گەنج مەجالی زانستی و داهێنانی بۆ نەڕەخساو تەنیا مەجال و بواری پوخڵەواتی و بێ ڕەوشتی دەبینی ، ئیتر کام داهێنان و توێژینەوەی زانستی ئەنجام بدات؟!!! هاوکاری نەکردنی گەنجان لە بواری زانستی و داهێنان و پاڵپشتی نەکردنیان ، ئەمە گورزێکی کوشەندەیە کە عەلمانی و حیزبە دەسەڵاتدارەکانی عەلمانی لە گەنجی موسڵمانی کوردیان داوە ، بە چاوی خۆمان بینیمان چەندین گەنج فڕۆکەی بێ فڕۆکەوان و ئۆتۆمۆبیل و زۆر شتیتریان دروست کرد بەڵام حوکومەت یارمەتی نەدان و ئیهمالی کردن ، ئەوانیش ناچار ڕۆیشتن لە شارەوانی خۆیان نووسی بۆ**

ئەوەی بژێوی ژیانیان دابین بکەن ، کاتێک دەسەڵاتی عەلمانی بەو شیوەیە ڕەفتار لە گەڵ گەنجان و داهێنانەکانیان بکات ، ئیتر چۆن گەنجی موسڵمانی کورد هێزو هزری دەمێنێت و داهێنانی دەبێت؟!!!

ئەگەر لە بیتان بێت ماوەیەک حیزبە عەلمانیەکان لە مەکتەبەکان سیستەمی سویدیان ڕاگەیاند ، ئاخر سیستەمی خوێندنی سویدی لە وەڵاتێک کە ژیانی ئەفریقی هەبێت چۆن جێ بەجێ دەکرێت؟ دواتر خراپی سیستەمی خوێندن هۆکارێکی سەرەکییە بۆ دواکەوتن و پێشنەکەوتن ، هەموو وەڵاتێک دەبێت سیستەمی گونجاوو شیاوی خۆی هەبێت ، نەک سیستەمی وەڵاتێک بێنیت وەک ئاسمان و ڕێسمان بێت ، کەواتە حوشتر دەبێت هەوسار بکرێت ، نەک کلێتەو کەراواتی بۆ ببەستیت ، سیستەمی خوێندنی وەڵاتانی عەلمانی ئێمەش دەقاو دەق وایە!!!.....

دونیاو فەزای ڕۆژئاوایەکان لە ڕووی ئایینەوە ، دونیایەکی فەوزەوی و سست و بێ تامەو لە روانگەی ئایینەوە تەواو بۆش و رووخاون ، هەر بۆیە ئەوەی لایەنێکی بتەوی ئایینی و عەقیدەیی نەبێت بۆشایی دەروونی بۆ دروست دەبێت و هەست بە داروخانی دەروونی دەکات ، هەر ئەمەشە ڕۆژانە لە بەر بێزاری و ستریس بوون و نەبوونی ئامانجێکی ڕوون و باوەڕ نەبوون بە دوا ڕۆژ ، ڕێژەیەکی بەرچاو خۆیان دەکوژن ، ئەمەش بۆشاییەکەو دەبێت هەوڵی پڕکردنەوەی بدەن ، کەوابو ئەمەش هۆکارێکیترە کە پاڵی بەوانەوە ناوە لایەنی تەکنەلۆجیایان بە هێزتر بێت و بەم شیوەیە ئەو سەرقاڵ بوونە ئەو بۆشاییەیان بۆ پڕ بکاتەوە .

کەواتە با کەس بە هەڵە تێنەگات و بە هەڵەدا نەڕوات فاکتەری پێشکەوتن لە بواری داهێنانی تەکنەلۆجیا عەلمانییەت و عەلمانی بوون نییەو نەبووەو نابێت ، ئەوەی بەو شێوەیە تێبگات ئەوە لە وەهم و خەیاڵدا دەژی و فڕی بە زانست و تەکنەلۆجیاو مەنتیق واقیعەوە نییە ئەگەر عەلمانییەت فاکتەری داهێنان و تەکنەلۆجیا بێت ئەی بۆچی عەلمانیە خۆماڵییەکان داهێنانیان نییەو لە موسڵمانەکە دواکەوتوترن؟ نەک هەر عەلمانییەت هۆکاری داهێنانی تەکنەلۆجیا نییەو نەبووە ، بەڵکو ئیلحادو بێ دینیش هەمان هۆکار نەبووە ، مەگەر وەڵاتێکی وەک ڕووسیای سۆڤیەت وەڵاتێکی فول بێ دینی نەبوو لە سەدەی ڕابووردوودا ، ئایا بێجگە لە کوشت و کوشتارو خوێن ڕشتن چیتری بەرهەم هێنا؟

مەگەر وەڵاتێکی بێ دینی وەک کۆریای باکور بێجگە لە بەرهەم هێنانی ئەسڵەحەو کەرەستەی شەڕ چی بەرهەم هێنا؟

ئایا بێجگە لە دروستکردنی ئەو هەموو چەکی کوشەندەیە چیتری بەرهەم هێنا؟

مەگەر خەڵکەکەی وەک کۆیلەکانی پێش لە ئیسلام ناژین و هیچ جۆرە ئازادییەکیان نییە؟!!!!

ئیتر نازانم بەرهەمی ئیلحادو عەلمانییەتی ناوخۆیی و جیهانی چی بووە ، بێجگە لە نەهامەتی و شەڕو کوشت و کوشتارو برسی کردنی خەڵک و داگیر کردنی وەڵاتان و کوشتنی زیاتر لە ٢٠٠ ملیۆن خەڵک لە سەدەی ڕابوردوودا؟

کەواتە ئەوە لوتکەی گەمژەییە کە هەندێک نۆما مولحیدو بێ دینی کورد بە موسڵمان دەڵێن : ئیسلام و موسڵمان پێشکەوتن و داهێنانی تەکنەلۆجیایان نییە ، ئەوان کاتێک دەڵێن ڕۆژئاوا پێش کەوتووە دەڵنیاین تەنیا قسەیەکەو فڕێی دەدەن و نازانن لە دونیای ڕۆژئاوادا چی دەگوزەرێت ، لە بەر ئەوە هەموو وەڵاتانی ڕۆژئاوا پێش نەکەوتوون ، ئەو وەڵاتانەی لە نزیک ڕوسیان ، وەک : ڕوسیای سپی و لیتوانیا و ئیستوانیا و دواتر وەڵاتانی بولگاریاو ماڵدوڤیا و هەندێک وەڵاتیتر ، زۆر دواکەوتوون و هیچ پێشکەوتنێکیان بە خۆوە نەدیوە.....

مەگەر زۆرینەی وەڵاتانی ئەفریقی حوکم بە عەلمانییەت ناکەن ، ئەی بۆچی ئەوانیش دواکەوتوون و نان نییە بیخۆن؟

مەگەر وەڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ئاسیا و وەڵاتانی ئەمریکای باشور زۆرینەیان کۆمۆنیستی نین ، ئەی بۆچی ئەوانیش دواکەوتوون؟

ئەی بۆچی وەڵاتانی پاناماو کۆبا پێشکەوتنیان نییەو لە چاندنی مادده هۆشبەرەکان زیاتر هیچ داهێنانکیان نییە؟

خۆ ئەو وەڵاتانە نە ئیسلامین و نە پابەندن بە ئیسلام و نە موسڵمانن ، ئەی بۆچی لە موسڵمانانی ئەمڕۆ دواکەوتوترن ؟

موسڵمانانی ئەمڕۆ ئێستاش سەرەڕای نەبوونی کەیان و ئوممەو دەسەڵاتێکی ئیسلام لێرەو لەوێی و لەولاتر داهێنان و توێژینەوەی زانستیان هەیەو دواتر بە بەڵگەوە دەیخەینەڕو...

## ئایا زانست و داهێنانی تەکنەلۆجیا موڵکی کەس و نەتەوەو سەدەو سەردەم و لایەنێکی دیاریکراوە؟ بەشی سێیەم

گەشە کردنی زانست و داهێنانی تەکنەلۆجیا سامانێکی سروشتی جیۆگرافیایەکی دیاریکراو نییە ، ئەم پێشکەووتن و گەشتە شارستانییەتە کە گەیشتووە بە لەتکردنی ئەلەکترۆن و نیوترۆن و پرۆتۆن و دۆزینەوەی کرۆمۆسۆم لە خانەدا و پەرەسەندنی کیمیک و تەواوی زانستە ماددی و ماتریالیەکان بەرهەم و زادەی بیرکردنەوەی سەردەم و نەتەوەیەک نییە ، ئەمە میرات و بەرهەمی سەرجەم سەدەو سەردەمی مرۆڤەکان و نەتەوەکانە بە درێژایی مێژوو ، ئیتر ئەوەی لەت کردنی زەرە=گەردیلە بە موڵکی خۆی بزانێت ، بە هەڵەدا ڕۆیشتووە ، لە بەر ئەوە سەدەو سەردەمانێک بووە ، زاناکانی زەڕە گوتوویانە : مادده لە زەڕە پێک هاتووەو زەڕەش دابەش ناکرێت ، ئەمەش لە کاتێکدا بووە کە لە قورئانەکەی ئێمەدا بەم شێوەیە باسی زەڕە کراوەو دەفەرموویت لە زەرە بچووکتر هەیەو زەڕەش بەش بەش دەبێت:

﴿ وَمَا يَعْزُبُ عَنْ رَبِّكَ مِنْ مِثْقَالِ ذَرَّةٍ فِي الْأَرْضِ وَلَا فِي السَّمَاءِ وَلَا أَصْغَرَ مِنْ ذَلِكَ وَلَا أَكْبَرَ إِلَّا فِي كِتَابٍ مُبِينٍ ﴾ [يونس: 61].

بەڵێ بەڕێزان زاناکانی پسپۆڕ لە بواری زەڕەدا تاکو سەرەتای سەدەی بیستەم وایان دەزانی لە زەڕە بچووکتر نییە ، بەڵام قورئانی پیرۆز پێش ١٤٤٠ ساڵ فەرموویەتی : لە زەڕە = گەردیلە بچووکتر هەیەو زەڕەش دابەش دەکرێت ، ئەمەش تەنیا نموونەیەکە کە قورئانی پیرۆز لە خارجی کەونەوە هاتووەو کەلامی مرۆڤ نییە.....

کەواتە ئەم زانست و داهێنانی تەکنەلۆجیایە بەرهەمی تەنیا ئایدیاو ئایین و مرۆڤ و سەدەو سەردەمێک نییەو بەرهەمی سەرجەم مرۆڤایەتیە بە هەموو بیۆگرافیای نەتەوەکان و جیۆگرافیا بەربەڵاوەکان و سەدەو سەردەمەکان ، ئەوەی دەڵێت : ئیسلام و موسڵمانان داهێنانیان نییەو نەکردووە دەکرێت گومانی مرۆڤ نەبوونی لێ بکرێت ، لە بەر ئەوە ئەوەی تۆزقاڵێک عەقڵ و زانست و هزری هەبێت زانست و داهێنانە تەکنەلۆجیاکان ناکاتە موڵکی ڕۆژئاوا ، یان سەدەو سەردەمێکی دیاریکراو ، ئەوەی مولحیدو بێ دینەکان بە حیقدەوە باسی دەکەن و دەڵێن : ئیسلام و موسڵمانان داهێنانیان نییە ، ئەو پەڕی حەماقەتەو دەبێت خەجاڵەتی بکێشن!!.....

دەرکەوتنی دیاری فەلسەفە کە بە دایکی زانست هەژماردەکرێت وەکو هێڵێک بۆ جیا کردنەوەی پرسە سەرەتاییەکانی پێشتر دادەنرێت ، بە نزیکەی ٦٥٠ ساڵ بەر لە دایک بوونی عیسا لە گریک، یۆنانیەکان یەکەمین دامەزرێنەری ئەکادیمیان بۆ ئەم باسە، تالیس و هیراکتۆلیس و فیساگۆرس و سوکرات و ئەفلاتون و ئەرستۆ لە گەورەترین کاریزماکانی ئەو دەمەن، ئەم شارستانیەتە دواتر بەرەو شەرق و جیهانی ئیسلامی و عەرەبی مل دەنێت و سەرجەم بوارە فیزیای و کیمیای و پزیشکی و هەندەسی و بایۆلۆژی و سایکۆلۆژیەکان بگرە تا دەگاتە پاراسایکۆلۆژیا و ئەنترۆپلۆژیا و ئارکۆپۆلۆژیا و جیۆلۆژیا و چی و چیش هەڵتۆقیون لە مەدرەسە ئیسلامیەکان و تاقیگە زانستیەکانی کاریزما موسڵمانەکانی وەکو خواریزمی و بوزجای و ابن هیثم و قەزوینی وابن العوام و ڕازی و ابن بەتوتە و ابن سینا و فارابی و کیندی و ابن روشد و ابن خلدون و فاروق الباز و کێ و کێ ، ئەمە جیا لە جوڵە نایابە زانستی و داهێنانە گەورەکانی بلیمەت و حەکیمە مەزنەکان لە کۆریا و چاینا و هیندی کۆن، ئەوجا کۆکراوەو و خولاسەی ئەم داستانە لە زەمەنێکی تردا و لە جیۆگرافیایەکی تر و لە هەگبەی مەزنەکانی وەکو نیوتن و میلیکان و ئافۆگادرۆ و بەرنۆڵی و مەندڵ و ئەدیسۆن و ڕێنە دیکارت و تۆماس مۆرگان و واتسن و تا دەگاتە ئەنشتاین و ئێستاش ستیڤن هاوکینگ و سەدانی تر لە بوارە جیاجیاکانی زانستی گەردونیدا لە ئەوروپا و ئەمریکا و جیهانی ڕۆژئاوا بە گشتی.کەوابوو هیچ کەس حەقی ئەوەی پێ نادرێ پەیوەستیەک لە نێوان نەتەوە و زانست، ئاینێک و زانست، زەمەنێک و زانستدا بکا، زانست موڵکی هەموو میللەت و ئاین و زەمەنە جیاجیاکانە، ئێستا کاروانەکە بە ئەوروپا و ئەمریکا گەیشتووە شتێکی زۆر سروشتیە، گەیشتنی زانست بە لوتکە لای ئەوان، فاکتەرەکەی هەمان ئەو فاکتەرانەن کە زانستیان بە لوتکە گەیاندبوون لە عالەمی ئیسلامیدا، نرخی کات زانین و بایەخدانە بە زانست و ڕێزگرتنە لە زانایان و دانانی پرۆگرامی چڕە. نەک ئاین بوبێتە هۆی دواکەوتویی بەشێک لە مرۆڤایەتی و دابرینی ئاین فاکتەری تەطەوری بەشێکی تری بێت، دەشێت ئەمە بۆ مەسیحیەت دروست بێت کە پاپا و قەشەکان

تا پێش هاتنی مارتن لیتەر و شۆڕشی فەڕەنسی و ڕێنسانس دەستیان بەسەر عەقڵیەتی کۆمەڵگاو تایبەتمەندێتی کەس و باوەڕی تاک و ئایدیای خەڵکدا گرتبوو، بەربەستێکی کۆنکرێتی بوون لە بەرامبەر داهێنانە زانستیەکان، بەڵام ئەمە هەرگیز لەگەڵ ئاینی ئیسلامدا ناگونجێ کە یەکەم سروشتی خوداکەی بۆ پەیامبەرەکەی بە (إقرأ) دەست پێدەکات و بە سەدان ئایەت عەقڵ دەبزوێنیت و مرۆڤ هانی موجازەفە و موغامەرەی هزری دەدات و دەقەکانی بە (أفلاتعقلون و آفلاتذکرون و ....) کۆتاییان دێت، ئاینێک کە مێژوو شایەتی بوونی سەدان مەدرەسە و ئەکادیمیا و کاریزمای زانستی گەردوونی بۆ دەدات، وەستانی زانست لای موسڵمانان لە ئێستادا بۆ گەمژەی موسڵمانان و بارودۆخی سیاسی و ناوچەی و تەسقیف بونیان بە نەیارانیانەوە دەگەڕێتەوە، نەک ئیشکال لە بنەرەتی ئایدیا و مادده دەستوری و مەرجەعە ئەساسیەکانی ئاینەکەوە بێت .

ئەگەر ئاین هۆکاری جەهالەتی کۆمەڵگای شەرقیە بۆ تا ئێستا داهێنانێکی زانستیمان نەبینی لەلایەن ماتریال و مولیحدەکانی ئەم مەملەکەتە کە لافی زانست لێدەدەن، خۆ مێژوویەکی تازەیان نیە، لە کۆمەڵگایەکی داخراوی وەک کۆمەڵگای کوردیدا لە بیستەکانی سەدەی ڕابردووەوە بانگەشەی ئیلحاد دەکرێت، کامە مەعمەلی عەلاگە یاخود گۆرەوی بەرهەمی چالاکی زانستی ئەم پیاوانەی عەقڵە؟

ئەو بابەتەی سەرەوەم لە بەڕێز دانیاڵ ژاکاو وەر گرتووە بە دەستکاری خۆمەوە.

کەواتە ئەگەر بە جوانی سەرنج بدەین بۆمان دەر دەکەوێت ئەوانەی وا دەڵێن : ئیسلام و موسڵمانان داهێنانیان نییە چەندە گەمژەو کەلە ڕەشن ، کام ژیری قەبوڵ دەکات ئایینێک بەم شیوەیە باسی زانست و بەشەکانی زانستی و گەردوونی بکات ، ئایینێکی دژی زانست و داهێنان بێت؟

کام کتێب و پەیام وەک قورئان پێش ١٤ سەدە باسی لایەنەکانی زانستی دەکات؟

کام کتێب و پەیام ئاماژەی زانستی وەک قورئان تێدایەو باسی بەش لەقەکانی زاست دەکات؟

لە قورئانی پیرۆزدا:

6 6 ϖئایەت باسی بیرکاری دەکات

64 ϖئایەت باسی فیزیا دەکات

5 ϖئایەت باسی ئەتۆم دەکات

9 ϖئایەت باسی کیمیا دەکات

62 ϖئایەت باسی شتە ڕێژەیەکان دەکات

100 ϖئایەت باسی گەردون دەکات

20 ﷺئایەت باسی کەش و هەوا دەکات

14 ﷺئایەت باسی ئاوو پێکهاتەی دەکات

11 ﷺئایەت باسی فەزاو گەردون زانی دەکات

12 ﷺئایەت باسی کشتوکاڵ دەکات

36 ﷺئایەت باسی زیندەزانی دەکات

73 ﷺئایەت باسی زانستی جوغرافیایی گشتی دەکات

10 ﷺئایەت باسی زانستی مێژووی و وەچە کانی مرۆڤ دەکات

20 ﷺئایەت باسی چین وتوێژەکانی زەوی دەکات

36 ﷺئایەت باسی زانستی گەردون ومێژووی ورِوداوە گەردونیەکان دەکات

64 ﷺئایەت بە گشتی باسی گەورەی زانست و زانایان بە شوێن زانست ڕۆشتندا دەکات

دواتر بە دەیان و سەدان باس و بابەتی تری زانستی تێدایە کە تاکو ئێستا نەدۆزراوەتەوەو هێشتا زاناکان لێی بێ دەنگن.....

کام ژیری دەڵێت : شوێنکەوتووانی ئەم پەیامە پیرۆزە زانستییە دژی زانست و داهێنانی تەکنەلۆجیان؟

کەواتە ئەوەی مولحیدو بێ دینەکانی کورد باسی دەکەن و دەڵێن : ئیسلام و موسڵمانان داهێنانیان نەبووەو نییە ، درۆیان کردو سەریان دای لە بەرد ، دواتر بە بەڵگەو داتاو سەرچاوە بەڵاوی دەکەینەوە کە فڕۆکەش داهێنانی موسڵمان بووەو زۆر شتیتر کە عەقڵی نەخۆش و بۆشی مولحیدەکان وەری ناگرێت.....

